# دەنكی قاوە

وانەیەكی سادە بۆ خولقاندنی گۆڕانكارییەكی ئەرێنی

نووسینی: جۆن گوردن و دامۆن وێست



ئەبوبەكر شیوەڕزی
لە ئینگلیزییەوە كردوویە بەكوردی

# دەنکی قاوە

وانەیەکی سادە بۆ خولقاندنی گۆڕانکارییەکی ئەرێنی

نووسینی:

جۆن گۆردن و دامۆن وێست

ئەبوبەکر شیوەڕزی

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بەکوردی

**پێشەکیی وەرگێڕ:**

سوپاس بۆ باری تەعالا کە لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە خنجیلانەیەش هاوکارم بوو و هێز و وزەی پێ بەخشیم. خوێنەری هێژا، زۆر جار لە ژیانماندا ژینگەی دەوروبەرمان لاوازمان دەکات، تەنگمان پێهەڵدەچنێت و وەک گێزەری ناو ئاوی کوڵاو هێز و توانامان لێ دەبڕێت. زۆر جار، بارودۆخی دەوروبەرمان دڵمان بەردئاسا ڕەق دەکات و کەللەڕەق و مێشک وشک دەبین. وەک هێلکەیەک کە دەیخەیە ناو ئاوی گەرم و ڕەق دەبێت. زۆر جاریش، ئێمە بەسەر بارودۆماندا زاڵ دەبین و ئاڵنگاری هەموو ناخۆشی و هەلومەرجە سەختە و قورسەکان و تاقەتپڕووکێنەرەکان دەکەین، ڕێک وەک دەنکی قاوە، گەر چەند دەنکێک بخەیە ناو پەرداخێک ئاوی گەرمەوە، ئەوا ژینگەی ئاوەکە دەگۆڕێت.

لە کتێبێکی وەها خنجیلانەدا، ئەم دوو نووسەرە خۆشەویستە دەیانەوێت بە وانەیەکی وەها سادەمان ئاشنا بکەن تا بەسەر هەموو لەمپەر و تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانمدا سەر بکەوین و یاریدەی خەڵکیش بدەن و دەستیان بگرین.

ئەبوبەکر شیوەڕەزی

٢٦ی ٤ی ڕەمەزانی ٢٠٢٠

قەڵادزی



عادەتەن ئەبراهام کەیفی بە وانەی زانست دەهات، ئەمما ئەمڕۆکە وانەبوو؛ ئەمڕۆ ڕقی لە زانست، قوتابخانە و هەموو شتێکی ژیان بوو. مامۆستا دڵخوازەکەی، م. جاکسۆن، چاوێکی بەنێو پۆلەکەدا گێڕا، دیقەتی دا کە ئەبراهام کەسی چەلان[1] نییە. لەدوای تەواوبوونی دەرسەکە، پێی گوت لە پۆلدا بمێنیتەوە، لێی پرسی ئاخۆ چ شتێک ڕوویداوە؟

---

[1] چەلان: جاران.

ئەبراهام کە هەمووان بە ئابی بانگیان دەکرد، بە مامۆستا جاکسۆنی گوت؛ لەمەڕ قوتابخانەدا لەژێر باری فشار و گوشاردا ڕێ دەکەم. وا ئەرکەکانی ماڵەوە و تاقیکردنەوەکان دێنە پێشەوە. جا باسی ئەوە هەر مەکە کە سەرتاپا نیگەرانی گەمەی تۆپانێی شەوی هەینیم.




لە کۆلێژ خەونی بە تۆپانێوە دەبینی، ئەوەشی بەرگوێ کەوتبوو کە دیدەوانەکانی کۆلێژ بەشدار دەبن، لایەنی براوە، هەنگاوێک تیمەکەی لە پاڵەوانیەتی نێزیک دەکاتەوە. بۆ نەگبەتی ئەو و پتر خراپکردنی دۆخەکە، دایک و باوکی شەڕ و هەرایەکی زۆریان بوو، بگرە بۆ یەکەم جاریش وشەی "جیابوونەوە"یان لەزاری هەڵوەری بوو.



ئابی گوتی، هەوڵ دەدات کێشـــەکانی بەلاوە بنێت و کاتێکی زۆر بە سۆشـیاڵ میدیا و سـەیرکردنی ڤیدیۆ بەسـەر ببات، بەڵام ئەوەیش یاریدەی نادات و وای لێ دەکات هەمتر هەســـت بە نەرێنی بکات و دڵتەنگ بێت. درێـژەی دایە قســەکـانـی: "هەینیێ[2] بە بـاشـــی گەمە دەکەیت، سـەختە پێشـهاتەکانی هەمـوو لایەک بـپێـکی. جـا لەوەیـش ســـەخـتـر ئەوەیە، هەنگینێ بە خـراپی یـاری دەکەت، قســـەی نەرێــنــی خەڵکیشت بەر گوێ بکەون،"



مامۆستا جاکسۆن سەری لەقاند، بە ئابی گوت؛ دەزانم کتومت هەستت چۆنە، ئیدی ڕۆیشتە سەر تەختەکە و هاوکێشە زانستییەکەی ڕەشکردەوە، ئەوجا وێنەی گێزەرێکی لەنێو مەنجەڵێکی ئاودا کێشا.



2 هەینێ، هەنگینێ: کاتێ؛ ساتێ؛ وەختێ.

مامۆستا جاکسۆن: "چی ڕوو دەدات وەختێک گێزەرێک دەخەیە نێو ئاوێکی فرە گەرمەوە؟"

ئابی بەرسیڤی[3] دایەوە: "گەرم دەبێت."

مامۆستا جاکۆسن وەڵامی دایەوە: "چاکە. لە گەرمبوون پتری بەسەر دێت. دەمەوێ بچیە ماڵەوە و ئەمشەو تاقی بکەیەوە و ببینی ئاخۆ چی بەسەر دێت."



ئابی گوتی: بەسەر چاو، گەرچی دەفکران ڕۆچووبوو، ئاخر چلۆن گێزەر خستنە نێو ئاوی گەرمەوە، ئەم لە کێشەکانی قوتار دەکات.

3 بەرسیڤ: وەڵام.



عــانێ ئــابی لە پۆلەکە دەچوویە دەرەوە، مامۆســـــتا جاکسۆن بە بزەیەکی گەورەوە گــوتــی: ”ئەهـــا، گەر قەت خـواردنـت لـێنەنـاوە، داوای یـارمەتی بکە، نـامەوێ خۆت بسووتێنی.“

ڕۆژی دواتر، لەدوای تەواوبوونی دەوام، ئابی بە مامۆستا جاکسۆنی گوت: ئەو گێزەرەی خستوویەتە ناو ئاوی گەرمەوە، لە دوای نزیکەی دە خولەک، نەرمونۆڵ بووە.



مامۆستا جاکسۆن گوتی: ”بەڵێ، گێزەرەکە بە حوکمی ژینگەی دەوربەری نەرم و لاواز بووە. ئەو هەلومەرجەی کە کەوتۆتە ناوی کاریگەریان لەسەر دروست کردووە.“

ئابی گوتی: ”بە چەشنێ وەک من بوو.“

بەرلەوەی مامۆستا جاکسۆن بچێتە سەر تەختەکە و وێنەی هێلکەیەک لەنێو مەنجەڵێک بکێشێت، بەرسیڤی دایەوە: ”ڕاستییەکەی ڕێک وەک تۆ بووە.“



”ئێستاکانە، پێم بێژە چی ڕوو دەدات ئەگەر تۆ هێلکەیەک بخەیە نێو ئاوی گەرمەوە؟“

ئابی بەرسڤی دایەوە: ”ئێ ئەوەیان ئاسانە، هێلکەیەکی توندی کوڵاوت دەست دەکەوێت، حەتتا ئەوەیش دەزانم.“

مامۆستا جاکسۆن وەڵامی دایەوە: "دروستە، ئاوە گەرمەکە هێلکەکە ڕەق دەکات. هێلکەکە بە هۆی ژینگە و ئەو هەلومەرجەی تێیدایە، ڕەق دەبێت."



"بەداخەوە، ئەمە بەسەر زۆربەی کەسیش دێت، دڵڕەق دەبن، توڕە دەبن، دەبن بە کەسێکی نەرێنی، جاروباریش بێهەستوهوست دەبن بە هۆی ئەو ژینگە قورسەیەی کە تێیدا ڕێ دەکەن. ئیدی تۆوی ڕق لە ژیان و خەڵک، لە ناخیاندا چەکەرە دەکات. دڵیان ڕەق دەبێت و ئەو ئارەزوویە لەدەست دەدەن بۆ ئەوەی خەڵکیان خۆش بوێت و خۆشبویسترێن. من نامەوێ وەها شتێک بەسەر تۆدا بێت، هەر لەبەر ئەمەیشە ئەم وانەیەت فێر دەکەم."



ئابی گوتی: "تێدەگەم."

ئێستە ئابی حاڵی دەبوو کە بۆچی مامۆستا دەربارەی گێزەر و هێلکە دەدوێت.

ئابی گوتی: "تێدەگەم، وەختێک گێزەر دەخەیە ناو ئاوی گەرمەوە لاواز دەبێت، هێلکەیش ڕەق دەبێت. بۆیە نامەوێ نە گێزەر بم، نەیش هێلکەم بم."

مامۆستا گوتی: "نا، نابێت هیچیان بیت، بەڵام وانەکە بەشێکی دیکەی ماوە، ئازمایشتێکی دیکە کە پێویستت پێیەتی تا ئەزموونی بکەیت و لێی تێبگەیت."



مامۆستا جاکسۆن وێنەی مەنجەڵ و هێلکەکەی ڕەشکردەوە و وێنەیەکی دیکەی کێشا. لەو وێنەیەدا دەنکە قاوەیەک لەنێو مەنجەڵەکەدا بوو.

مامۆستا جاکسن پرسی: "چی ڕوو دەدات ئەگەر دەنکە قاوەیەک بخەیە نێو مەنجەڵێکی فرە گەرمەوە؟"

ئابی وەڵامی دایەوە: "نازانم."



مامۆستا جاکسۆن چەند دەنکە قاوەیەکی لە شووشەکەی سەر مێزەکە دەرهێنان و خستنیە دەستی ئابییەوە، گوتی: "زۆر چاکە، ئەو جارەیان پێویستە ئەمە بکەیت، بچۆ ماڵەوە و ئەم دەنکانە بۆ نزیکەی نیو کاتژمێر بخە ناو مەنجەڵێکی ئاوی گەرمەوە، ئەوجا سبحەینێ بۆم باس بکە ئاخۆ چی بەسەر هاتووە."



هەنگینێ ئابی هۆدەکەی بەجێ هێشت، مامۆستا هاواری کرد: ”ها ئاگاداری خۆت بە، خۆت نەسووتێنی!“



بەیانی دوای تەواوبوونی دەوام، ئابی لە مامۆستا جاکسۆن نزیکبوویەوە و بە خۆشحاڵییەوە باسی ئەوەی بۆ کرد، کە دەنکە قاوەکان، ئاوەکەیان کردووە بە قاوە.

گوتی: ”دەمزانی دەنکە قاوەی هاڕدراو دەبێتە قاوە، ئەمما نەمدەزانی دەنکەکەیش هەمان ڕۆڵ دەبینێت.“

مامۆستا جاکسۆن گوتی: ”ئەرێ، هەمان ڕۆڵ دەبینێت، بەڵام کاتێکی پتری دەوێ.“

ئابی گوتی: ”وەک سیحر وایە.“

مامۆستا جاکسۆن وەڵامی دایەوە: ”وایە، وەلێ من حەز دەکەم ناوی بنێم گۆڕان.“



ئەوجا مامۆستا جاکسۆن چوویە سەر تەختەکە و، وێنەی هەر سێ مەنجەڵەکەی لە تەنیشت یەکتری کێشان، لە هەر مەنجەڵێکدا وێنەی گێزەر، هێلکە و دەنکی قاوەی نەخشاندن.

لەو وەختەی مامۆستا ئاماژەی بە تەختەکە دەکرد، گوتی: "ئەمە سادەترین و بەهێزترین وانەیە کە فێری دەبیت."



"زۆر جار ژیان لە مەنجەڵێکی ئاوی گەرم دەچێت، دەشێ شوێنێکی بە زەبر و زەنگ، پڕ لە فشار و گوشار و سەخت بێت. خۆت لەو ژینگەیەدا بەدی دەکەیت و ڕووبەڕووی هەلومەرجەکان دەبیەوە، تۆ تاقی دەکەنەوە ئاخۆ هەر بە ڕاستی چ چەشنە کەسێکی."

ئابی گوتی: "وەک ئەو نەگبەتیانەی من بە نێویاندا ڕێ دەکەم."

مامۆستا وەڵامی دایەوە: ”بزەبت.“



”تۆ هەست بە فشاری قوتابخانە دەکەیت، ئەرکەکان و تاقیکردنەوەکان. هەست بە گەرمایی پێشهاتەکانت دەکەیت کە بە بەدەنتدا هەڵا دێت لەهەمبەر بوون بە یاریزانێکی مەزن. هەست بەوە دەکەیت کە دەکرێ هاوسەرگیری دایک و باوکت هەڵبچێت. ڕکوکینی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو بارە نەرێنییەی کە لە جیهاندا پەرەدەسێنێ؛ ئەمانە هەموویان یەک مەنجەڵی گەورەی ئاوی گەرمن. وێڕای ئەمەیش، بژاردەیەکت هەیە.“



"دەتوانیت وەک گێزەرەکە بیت کە ژینگەکە نەرمونۆڵ و لاوازی دەکات.

دەتوانیت وەک هێلکە بیت کە ناورودۆخ ڕەقی دەکات.

یانیش، دەتوانیت وەک دەنکی قاوە بیت، کە ژینگەی خۆی دەگۆڕێت."

"وە هەر کاتێ سەیری تۆ دەکەم، نە گێزەر دەبینم، نە هێلکە، بەڵکە لە



تۆدا دەنکە قاوەیەک دەبینم کە بەسەر ئاڵنگارییەکانی سەر دەکەوێت و جیهان دەگۆڕیت."



"دەمەوێت بۆ تەواوی ژیانت ئەم وانەیەت لە زیهندا بمێنێتەوە، دەچییە هەر کوێیەک، هەر چییەک دەکەیت، لە بیرت نەچێت تۆ دەنکی قاوەیت، تۆ ئەو هێزەت هەیە کە ژینگەی دەوروپشتی خۆت بگۆڕیت.

جا گرینگ نییە شتەکان چەندێک ڕەق دەبن، یان شتەکان چەندێک هیوابڕاو بەدیار دەکەون، کۆڵ مەدە. لەبیرت بێت کە ئێمە جیهانی خۆمان لە دەرەوەی ناخمان ناخولقێنین، بەڵکە گووراندن[4] و گۆڕینی ژیان لە ناوجەرگەی ناخمانەوە دەست پێ دەکەت."



[4] گووراندن: ئەفراندن؛ دروستکردن؛ خولقاندن.



”گەر تـــۆ بـــاوەڕت وا بێــت گێزەریــت، ئەوا بــاوەڕ بەوەیــش دەکەیــت کە هێــز و پــاڵنەری دەرەکــی بەهێزتــرن لە ئیــی نــاوەکی، ئەوســا تــۆ دەبیت بە کەسێکی لاواز.“

”گەر تۆ باوەڕت وا بێت هێلکەیت، ئەوا باوەڕیش بەوە دەکەی کە باری نەرێنی لە جیهاندا دەسەڵاتی ئەوەی بەسەرتدا هەیە دڵت ڕەق بکات، وات لێ دەکات وەک ئەو خەڵکە، کەسێکی نەرێنی بیت.“



”ئەممــا گەر بزانیت تۆ دەنکی قــاوەیــت، ئەوا ڕێگە نــادەیــت جیهــانی دەرەکی کاریگەری لەســـەر تۆ دروســــت بکات. ئیدی درک دەکەیت کە هێزی ناوەکیت لە ئیی دەرەکی مەزنترە. بۆیە بەم هێزە ناوەکییە دەتوانیت ژینگە و جیهانی خۆت بگۆڕیت.“



"هێزی ڕاستەقینە لە ناو جەرگەی ناختدایە، بۆیە ببە بە دەنکی قاوە."



پاشان مامۆستا جاکسۆن دەستی بۆ باخەڵی[5] برد، دەنکە قاوەیەکی هێنایە دەرەوە و دایە ئابی؛ "ئەمە لە باخەڵی خۆتدا هەڵبگرە، وەک یادخەرەوەیەک کە تۆ کێی و خاوەنی چ هێزێکی. دەزانم داهاتوویەکی گەش چاوەڕێتە."



ئابی پۆلەکەی بەجێ هێشت، تەواو خۆشحاڵ و پڕ وزە بوو بەوەی کە دەنکی قاوە بوو، ئامادەبوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئالنگارییەکانی ژیانی ببێتەوە، دەست بکات بە گەمەیەکی گەورەی تۆپانێ لە شەوی هەینیدا، ئیدی چی دیکە لەمەڕ ئەرک و قوتابخانە یان هاوسەرگیری دایک و باوکی لەژێر باری فشار و گوشاردا تەی نەدەکرد. دیدگای گۆڕابوو، وزەی وەچەرخابوو، دۆخی ئاوەزیشی برەوی سەندبوو.

---

5 باخەڵ: گیرفان.



ئەو هەفتەیە، وەختێ ڕاهێنەرەکەی لە ماوەی مەشقکردندا قسەی دەکردن، دەربارەی ئاخۆ دەتوانی چی بەرزەفت بکەیت، نیگەرانی ئەوە نەبیت کە داخۆ میدیا چی دەڵێت یان داخۆ دەرەنجامی گەمەکە چی دەبێت، ئابی بە ئاسانی دەیزانی کە مەبەستی وی ئەوەیە ببیت بە دەنکی قاوە.

چیرۆکی گێزەر و هێلکە و دەنکی قاوەکەی بە ڕاهێنەر و تیمەکەی گوت، پاشان دەنکی قاوەی دا بە تەواوی تیمەکە. پێی گوتن کە گرینگ نییە لە کوێ یاری دەکەن یان لەگەڵ کێ گەمە دەکەن. گرینگ نییە ئاخۆ جەماوەر چەپڵە لێدەدەن یان فیکە لیدەدەن. ئەوەی گرینگە هێزەکە لەناو خۆی خۆماندایە نەک لە مشتی ئەوان.





ئەو شەوە باشترین یاریان کرد و کۆڵیان نەدا هەتا پاڵەوانییەتەکەیان بردەوە.



هەرچەندە، ئابی لەو پاڵەوانییەتەدا بریندار بوو، لە چواریەکی کۆتاییدا، کە تەنیا چەند خولەکێکی مابوون، زۆر بە جوانی گەمەی دەکرد بۆ ئەوەی بردنەوە مسۆگەر بکات، بەڵام خراپ بەسەر عەردەکەدا کەوت. پێیەکانی عەردیان نەدەگرت، نەیدەتوانی یاریگاکە بەجێ بهێڵێت، لە لێواری یاریگەکەوە سەی دوا خولەکەکانی گەمەکەی دەکرد.



ئیدی دوای چەند ڕۆژێکی کەم، ئەشـــیعەی تەنووری دەریـخســـت کە دەبـێـت نەشـــتەرگەری بۆ بکرێت بۆ چـاکـکـردنەوەی $(ACL)$ لە ئەژنۆیـدا. لەبەرخۆیەوە گوتی ئەمە کاریگەری لەسـەر توانای دروست دەکات لەمەڕ یاریکردن لە کۆلێژ، ئەمما ڕێگەشی نەدا برینەکەی لە پەلوپۆی بخات. لە ڕابردوودا، نسـکۆیەک هەڕەشـەی وێرانکردنی ژیانی لێ دەکرد، بەڵام لەباتی ئەوە، بیری لە ڕێگەگەلێک کردەوە بۆ ئەوەی ئەم بارە نەرێنییە بۆ کەشێکی ئەرێنی بگۆڕێت.



بڕیاری دا یانەیەک بە ناوی دەنکی قاوە بکاتەوە، ئەم یانەیە تیشکی دەخستە سەر ئەوەی کە خوێندنگە و کۆمەڵگە و جیهان بکات بە شوێنێکی

ئەرێنیتر. بۆیە، وێڕای چوونی بۆ یانە و ئازاری چۆکی، کاتی بە داواکردن لە هاوپۆلەکانی بەسەر دەبرد بۆ ئەوەی بەشداری لەگەڵ بکەن و سەردانی قوتابخانە دواناوەندییە ناوخۆییەکان بکەن، لەوێ کتێبی منداڵانی بۆ قوتابییەکان دەخوێندەوە.




ئابی و یانەکە نامەی ئەرێنییان بۆ ئەو قوتابیانە دەنووسی کە وێدەچوو بە کاتێکی سەختدا گوزەر بکەن و ئاوێتەی ئەفکارنواندنێکی خۆکاری میهرەبان بوون. هەروەها پۆستکردنی نامەی ئەرێنی لە سۆشیاڵ میدیاکان کرد بە ئەرێکی سەرشانی خۆیان، لە کۆتایی هەر پۆستێکیدا هاشتاگی دەنکی قاوەیان دادەنا.



ئابی بە هاوپۆلەکانی گوت: ”ئێمە نابێت ڕێگە بە هێزی نەرینی بدەین کاریگەری لەسەر ئێمە دابنێت لە تۆڕی کۆمەڵایەتیدا، لە جیاتی ئەوە، ئەوە ئێمەین کە دەتوانین بە شێوەیەکی ئەرێنی کاریگەری لەسەر تۆڕی کۆمەڵایەتی دروست بکەین، یەک کەس لە یەک کاتدا.“



ئیــدی بە تێپەڕبــوونی بــاقی ڕۆژەکــانی قوتابخــانە، چــۆکی ئــابی بەهێزتــر بــوو و کاریگەرییەکەیشــــــــی بــرەوی ســـەند، لە کۆتــایی ڕۆژەکــانی خوێندنــدا، وەک ڕۆژی ڕوونــاک دیــار بــوو کە یــــــانەکە ژیــــــنگەی خوێنــــدنگەکەی گۆڕیـــــوە. ئیــدی نەرێنیبــوون هــیچ مانــایەکی نەبــوو، بەڵکــوو لەبــری ئەوە، بــوون بە دەنکــی قــاوە و یارمەتیدانی خەڵک شتەکی مانابەخش بوو.



لەدوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، ئابی لە ئەکادیمیای سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا درێژەی بە خوێندن دا، تا خزمەت بە نیشتیمان بکات و تۆپانێش بکات. گەرچی تیمەکانی کۆلێژ لەبەر برینەکەی لاقی ئەویان ناونووس نەکرد، بەڵام ئەکادیمیای سەربازی، خۆشیان لە دیدگە و هەڵسوکەوتی ئەو دەهات، دەوبڕوایەدا بوون کە ئەو کوڕە هێزێکی وەهای تێدایە کە بەو جۆرە سەرکەوتنەی گەیاندووە.






لە چەند مانگی سەرەتای خوێندندا، هەنگینێ ئابی ڕووبەڕووی سەختترین ژینگە و هەلومەرج بوویەوە کە ئەو دەمێک بوو ئەزموونی کردبوون، بۆی دەرکەوت کە بۆچی هەندە هەڵسوکەوت گرینگە.

مەنهەج و خشتەی دەرسەکان بە شێوەیەک ڕێکخرابوون کە وایان لە قوتابی دەکرد بکەون، قوتابییەکان نەیاندەتوانی مرۆڤانە ئەرکەکانی سەرشانیان جێبەجێ بکەن، بەمەیش لە بابەتێک دەکەوتن. ئەکادیمیان ئەو قەناعەتەی هەبوو کە لە ڕێگەی کەوتنەوە زۆربەی قوتابییەکان بەهێزتر، ژیرتر و باشتر دەبن. ئەوانەی کە ناتوانن لە چاڵی کەوتن خۆیان دەرباز بکەن، هەر ئەوانەن کە دەکەون، ئیتر لە ڕێگەی ئەم پرۆسەیەوە یان فێرخوازیان دەردەکردن یانیش بەهێز و پتەویان دەکردن.




ئابی یەکێک بوو لەو قوتابیانەی کە مکووڕ بوو کۆڵ نەدات، نهێنی چەکی ئەویش؛ دەنکی قاوە بوو.

لە ئەکادیمیا، ئاوەکە لە هەموو شوێنێکی دیکە گەرمتر بوو، ئەمما ئەو ئەمەی بە دەرفەتێکی گەورەتر زانی بۆ ئەوەی ژینگەکەی بگۆڕێت و بە هۆی ئەو ژینگەیەوە لەڕولاواز یان ڕەقوتەق نەبێت.



به خۆی گوت کە شکست، پێناسەیەک نییە، بەڵکە ڕووداوێکە. تەنیا لەبەر ئەوەی دەکەویت، مانای ئەوە نییە تۆ کەسێکی شکستخواردووی، ئەمە تەنیا دۆخێکە کە دەبێت بەسەریدا زاڵ بیت و بیگۆڕیت، گەر تۆ تینووی فێربوون و گەشەکردن بیت، ئەوا شکستخواردن بەهێزترت دەکات.




ئابی لەبارەی هاوسەرگیری دایک و باوکیشی هەمان هەستی هەبوو، کە بەداخەوە بە جیابوونەوە کۆتایی هاتبوو، گومانی تێدا نییە کە خەفەتی لەو جیابوونەوەیە دەخوارد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕێگەی نەدا ئەو دۆخە پێناسی ژیانی وی بکات یان پێناسەی پەیوەندی ئەو لەگەڵ پەیوەندی ئەواندا بکات. ئابی دەیوست دایک و باوکی بگۆڕێت، بەڵام لەوەدا سەرکەوتوو نەبوو،

بەڵکوو ئەوەی لە دەستی هات تەنیا ئەوە بوو ئەوانی خۆش بووێت و یارمەتیان بدات بێقڕەوبڕە لەگەڵ یەکدی هەڵبکەن.

ئابی وەک ڕابەرێک گەورەبوو، هەر لە ئەکادیمیا بوو بە ئەستێرەی یاری تۆپی پێ، وانەی دەنکی قاوەی لەگەڵ زۆرێک لەگەڵ قوتابییە هاوڕێ و یاریزانەکان باس کرد، بگرە بۆ ئەفسەر و مامۆستا و ڕاهێنەرەکانیشی بەیان کرد.



ئەو تیمە بوو بە یەکێک لە باشترین تیمەکانی مەملەکەتەکە، لەدوای چەند ساڵێک، ئەکادیمای سەرنجی دا کە کەسانێکی کەمتر وازدەهێنن، درکیان کرد، کە لە ڕابردوودا، قوتابییەکان لەبەر ئەوە وازیان نەهێناوە کە نەیانتوانیوە بەرگەی بەڵا و نەهامەتییەکان بگرن، بەڵکوو لەبەر ئەوە وازیان هێناوە کە وەک گێزەرێک خۆیان دیتووە.




وەختێک ئابی چاوەکانی کردنەوە و یاریدەی دان بۆ ئەوەی درک بکەن کە ئەوانیش دەتوانن ببن بە دەنکی قاوە، ئەوانیش بڕیاریان دا پەرە بە خوێندن بدەن. ئەکادیمیا هێشتان هەر گوشاری چەلانی دەکار دەهێنا و هەلومەرجەکانیش وەک خۆیان بوون، کەچی ئەوەی گۆڕانکاری بەسەر هات قوتابییەکان بوون، ئەو ڕاستییەیان بەدیکرد کە ئاخۆ ئەوانە کێن. لەوە حاڵی بوون کە چی دیکە قوربانی دەستی ژینگەکەیان نین. درکیان بەوە کرد کە ئەوان خاوەنی چ هێزێکن بۆ ئەوەی بەسەر ئەو دۆخەدا زاڵ بن و گۆڕانکاری بەسەردا بهێنن.



لە دوای ئەوەی تەخەرووجی لە ئەکادیمیا کرد، وەک سەرۆکێک لە سوپادا درێژەی بە خزمەتکردن دا و، دەنکە قاوەکەیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. دەچوویە هەر کوێیەک، ڕابەرایەتی هەر مەفرەزەیەکی دەکرد، وانەی دەنکی قاوەی لەگەڵ هەموو سەربازەکانی باس دەکرد، وەک بیرخەرەوەیەکیش دەنکێکی قاوەی دەدانێ. سەربازەکان شتی لێوە فێر دەبوون، ئەلحەقی ئەویش لەوانەوە شت فێر دەبوو.



لە هەندێ لە هەرە خەتەرترین شوێنەکان و بارودۆخەکاندا، دەمدیت سەربازەکان گیانیان فیدای نیشتیمان و یەکتر دەکەن.



ئابی فێر بوو کە خۆشەویستی لە ترس گەورەترە. هەروەها خۆشەویستی ئەوان و ئارەزووی قوربانیدانیان بۆ یەکدی گەورەترە لە دەرەنجامێکی زیانبەخش. ئابی بیستبووی کە خۆشەویستی ترس لە ڕەگوڕیشە دەردەکێشێ. ئێستەیش ئابی ئەمەی بە چاوەکانی خۆی دەیدیت.

ئابی دەوبڕوایەی دابوو کە تێگەیشتن لە کارلێکی نێوان خۆشەویستی و ترس، کتومت ڕەنگدانەوەی وانەی دەنکی قاوەیە. بۆیە، سەربازەکانی فێرکرد، وەختێک ترس و نیگەرانی لاوازت دەکەن یان دلّڕەقت دەکەن، ئەوا خۆشەویستی ئێوە و خەڵک و ئەو دۆخەی کە تێیدان، دەتانگۆڕێت.




گەر بزانیت تۆ دەنکی قاوەیت و لەژێر سێبەری خۆشەویستیدا دەژیت و ڕابەری دەکەیت، ئەوا بە هیچ شێوەیەک ترس دەرۆستی تۆ نایەت.



جێگەی سەرسامی نییە کە یەکەکانی ئابی، یەکێک بوون لە یەکگرتووترین، مەشقپێکراوترین یەکە و جوانترین نمایشیان هەبوو لە سوپاکەدا.

وەختێ پێنج ساڵی خزمەتی تەواو بوو، ئیدی گەڕایەوە شارۆچکەکەی خۆی.



هەنگینێ ئابی گەڕایەوە ماڵەوە، هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستەکەی قۆناغی ئامادەیی کرد، هەروەها وەک ڕاهێنەرێک کاری خۆبەخشی لە پێناو تیمە کۆنەکەی قوتابخانە دەکرد. کەیفی بە ڕاهێنەری دەهات، ئەمما حەزێکی

گەورەتی هەبوو کە کاری بازرگانی بوو. خۆی و خێزانەکەی قسەگەلێکیان لەمەڕ پێکەوەنانی خێزاندا دەکرد، بەمەیش بەدوای کارێکدا گەڕا تا یاریدەی خێزانەکەی بدات.



سەرەنجام لە بواری فرۆشتندا کارێکی وەگیر کەوت، ئیدی ئەوەندەی نەبرد خێزانەکەی بە یەکەم منداڵی دووگیان بوو. لە چەند ساڵی داهاتوودا، بوون بە خاوەنی سێ دانە منداڵ.



لەگەڵ فراوانبوونی قەوارەی خێزانەکەی، ئابی شەو و ڕۆژی لەسەر یەک دانابوون بۆ ئەوەی خەرجی خێزانەکەی بکات. کێشەکە ئەوە بوو، تا پتر بە جددی کاری بکردایە، قەوارەی بڕی فرۆشنی لە کەمی دەدا، لە پڕێکدا هەستی بە فشارێکی زۆر کرد لەهەمبەر کێشانی خەرجی خێزانەکەیدا، جا بۆ

نەگبەتی ئەویش، کۆمپانیاکەی کە بە هۆی گۆڕانەکانی تەکنەلۆژیا و هەلومەرجی ئابووری کۆنترۆڵیان لە دەست دابوو، باش کاری نەدەکرد.




ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەفتە لە دوای هەفتە، کەمتر ئامانجی بڕی فرۆشتنیان دەپێکا و داهاتیان لە کورتی دەدا، لێشاوی ترس و فشار تا قوڕقوڕۆگەی هەڵکشا و نیگەرانی داهاتووی خێزانەکەی بوو.





هەینیێ خێزانەکەی حەولی دەدا دەربـــارەی هەوڵ و ماندووبوونەکانی قســـەی لەگەڵ بکات، ئەم هەر دەیگوت: "چارەی دەکەم." لە هــۆدەکە دەچــوویە دەرەوە. هەتــا پتر خێزانەکەی هەوڵی دەدا پشتگیری بکات، ئەو پتر دەرکەی بە ڕوودا گەڵە دەدا.

بە جۆرێک سەیری ماڵ و منداڵەکەی نەدەکرد کە دیارییەک بن، بەڵکە بە چەشنێ لێی دەڕوانین کە بارێکن و بە تۆپزی بەسەریدا سەپاون. سەیری ڕەهن، دوو ئۆتۆمبێلەکە، تێچوونەکانی پزیشک، قەرزەکانی کرێدت کارت کرد، سەیری ئەو کەسانەیشی کرد کە ژیانیان بەوی گرێدراوە.



ڕۆژێکی سارد و سڕی زستان، لە بەرەبەیانییەکی ڕۆژی شەممەدا، ئابی بە تەنێ لە موبەقەکە ڕۆنیشتبوو، کوپێک قاوەی دەخواردەوە و بیری لە هەنگاوی داهاتوو دەکردەوە، خێزانەکەی، منداڵەکانی لە ماڵەوە بردبوونە دەرەوە تا خۆیان لە شووم و خەموپەژارەی وی بەدوور بگرن.

*کارێک بدۆزەوە. بگەڕێوە ناو سوپا. سەر هەڵگرە و ببڕای مەگەڕێوە.* ئەمان بیرۆکەگەلێک بوون کە بیر و هزری ویان تەنی بوو. کوپە قاوەکەی دانا و سەری لەنێو دەستەکانیدا شاردەوە، هەمدیس سەری کووپەکەی کردەوە و هەڵمی گەرمی دەبینی کە لەسەر قاوەکە بەرز دەبوویەوە. وەلێ ڕۆژێکی سارد بوو، بەڵام قاوەکە بەدەنی ئەوی گەرم دەکردەوە.



سەری ڕاوەشاند، ئەی هاوار چەند بە ئاسانی لەفکرم چووە. ئەو وانەیەی لەبیر چووبوو کە چەند ساڵێک لەمەوبەر ژیانی ئەوی گۆڕی بوو. ڕێگەی بە ژینگەی دەوروپشتی خۆی دابوو تا لەڕولاوازی بکات و لە هەمان کاتیش ڕەقوتەقی کردبوو. وەختێ ڕووبەڕووی تەنگانە دەبییەوە چەندێک خێرا هژوومت بۆ دێنێ، ئیدی بەردی بناغەت دەلەرزێت و ترسوبیم ڕیشە دادەکوتێ.



ڕۆیشتە دوکان و هەندێ دەنکی قاوەی کڕین، دەنکە قاوەکانی خستنە ناو شووشەیەکی سەر مێزەکەوە، ئیدی سوێندی خوارد هەمدیس لە بیریان ناکات، جارێکی دیکە ڕێگە بە بارودۆخ نادات پێناسەی ئەو بکەن، یان پێناسەی داهاتووی خێزانەکەی بکات.




ساتێ خێزان و منداڵەکانی گەڕانەوە ماڵەوە، پۆزشی لە حزوور وان هێنایەوە و گوتی: "ئەمڕۆکە دەستپێکی ڕۆژێکی نوێیە بە یاوەری دەنکی قاوە."

لە ڕۆژی دووشەممەدا لە سەرکار بە چەشنێک خۆی نواند کە چارەسەر و پەیمان و باوەڕی هەیە لە پێناو دۆزینەوەی ڕێگەی سەرکەوتن. هەرواشی کرد.



زۆر لە کەشەدا نەمایەوە تا هاوپیشە و ڕابەرەکانی دیقەتی هەڵسوکەت و وزە و ئەنجامەکانی بدەن.

کاتێ هەمووان دەهاتن و دەچوون و هەستیان بەداخ دەکرد، تامەزرۆی ڕۆژانی ڕابردوو بوون، ئابی سەری خۆی دانەواند و بەجددی کاری دەکرد، برەوی بە دەرفەتگەل و پەیوەندی نوێ دا، ڕۆژانێکی باشی بۆ خۆی ئەفراندن. لە ماوەیەکی کەمدا، بوو بە بەڕێوەبەری فرۆشتن لەو ناوە. ساڵێک دواتر، بوو بە بەڕێوەبەری فرۆشتن لە ناوچەکەکە.



زۆرێک لە خەڵک و بەڕێوەبەرەکانی فرۆشتن گلەیی و گازندەیان لەمەڕ بارودۆخ و لایەنی ئابووری دەکرد، بەڵام ئابی وانەی دەنکە قاوەی فێری تیمەکەی خۆی کردبوو. دەست لەناو دەست، تیشکیان خستبوویە سەر ئەو شتەی دەتوانن بەرزەفتی بکەن. بەوپەڕی گەشبینییەوە کاریان دەکرد بۆ ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە کۆمپانیاکەیان ببێت بە پلە یەک لە ناوچەکەدا.

سەرانی کۆمپانیا هیچیان پێ نەدەکرا، ئەوە نەبێ سەرنجی ئابی و تیمەکەی بدەن کە پەیڕەوی شتێکی جیاواز دەکەن.



بە کەمبوونەوەی بڕی فرۆشتن و دەستکەوتنی قازانجێکی کەم، دەیانزانی کە دەبێت شتیک بکەن تا کۆمپانیاکەیان و داهاتوویان بپارێزن. بۆ ئەم مەبەستەیەش، پلەی ئابییان بەرزکردەوە بۆ سەرکاری فرۆشتن و بازاڕکردن. تەمەننایان دەکرد ئابی بتوانێت شتەکان ئاسایی بکاتەوە.

ئابی بە هەموویانی گوت، لەبری ئەوەی لە داهاتوو بترسن، ئەوان ڕووبەڕووی ئالنگاری و کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەمیان دەبوونەوە.



شەو لەدوای شەو، ئەو کێشانەی کە کۆمپانیاکەی ڕووبەڕوویان دەبوویەوە، لەگەڵ خێزانەکەی و منداڵەکانی تاوتوێی دەکردن. ئابی خێزانەکەی ئاوێتەی کێشەکان دەکرد تا چارەسەر بدۆزنەوە.



گەرەکی بوو، منداڵەکانی فێری ئەوە بن کە ببن بە کێشە چارەسەرکەر و سەرگەردانی چارەسەر بن، لەجیاتی ئەوەی ببن بە گلەیی و گازندەکەر و لۆمەکار.

خۆی و خێزانەکەی بڕیاریان دا، کە منداڵەکانیان فێر بکەن نەک تەنیا بژین و بەس، بەڵکە دەیانویست فێریان بکەن کە چۆن خەبات و تێکۆشان بکەن.





گومانی تێدا نییە، ناوەناوە وانەی دەنکە قاوەیان لەگەڵ ئەواندا دەهێنا گۆڕێ، حەتتا منداڵەکان بەشداریان لە ئامادەکردنی تەواوی بابەتەکانی کۆمپانیا دەکرد.

ئابی لە کۆبوونەوەی نەتەوەیی فرۆشتن، پلانەکەی خۆی بۆ بردنەوەی ئاوەزیان، بردنەوەی ئۆفیسەکانیان، بردنەوەی کڕیارەکانیان، بردنەوە لە بازاڕەکاندا و بردنەوەی داهاتوو پێشەکەش کرد. وانەی دەنکی قاوەش بەشێکی گەورەی بابەتی پێشکەشکردنی بوو. بۆ جەختکردنەوە لەسەر پەیامەکەی ئەزموون و دنیا بینی خۆی لە گەشتی ژیانیدا، بۆ ئەوان باس دەکرد.




لەدوای ماوەیەکی دوور و درێژ، خەڵک بۆ یەکەمین جا لێوانلێو لە وزە و خۆشحاڵییەوە هاتنەوە سەر کارەکانیان و بەیەکەوە داهاتوویان خولقاند.



بەڵام وێڕای ئەو پەڕی دڵخۆشی و گەشبینی، هێشتان هەر ئاسان نییە و دەرنجامەکان لە شەوێکدا نایەنە بوون، خەڵکانێک هێشتان هەر لە زەلکاوی ترسدا بوون و دەیانپرسی ئاخۆ دەبێ پلانەکەی ئابی بتوانێت یاخوود هەر بە ڕاستی سەر بگرێت، چونکە ئەو بارودۆخەی تێیدا بوون، هیچ باش نەبوو.



بەڵام ئابی کۆڵی نەدا، باش دەیزانی ئەمەیش دۆخێکە و پێویستە بگۆڕدرێت. پلانەکە، بیروباوەڕی و دەنکی قاوەی لەگەڵ هەموو کەسێک باس دەکرد.

ئەوجا ئامانجەکەی پێکا.



لەدوای ئەوەی كۆمپانیاكە تاڵترین ئەزموونی دارایی لە مێژووی خۆیدا چەشت، گوڵی سەركەوتن پشكووت.

بە هاوكاری و ئەدای ئاڕاستەكردنی ئابی، كۆمپانیا خۆی لەگەڵ كەشەكە گونجاند، داهێنانی كرد، بەرهەم و خزمەتگوزاری نوێی خستە بازارەوە. ئەو شتانەی سڕینەوە كە چی دیكە كەڵكی كاركردنیان نەمابوو، چەند بەرنامەیەكی خستنە كارەوە، ڕووئیای كۆمپانیاكەی لە ڕووی تەكنەلۆژیا و بیرۆكە و كاری جددیەوە گۆڕی.



لە جەرگەی كاركردندا، زۆرێك لە كۆمپانیا ڕكابەرەكانیان بەرەو نەمان دەچوون، كۆمپانیاكەی ئابی قوتاری بوو.

سەرچاوەی ئەو هێزە ڕاستەقینەیان دەگەڕاندەوە بۆ دەنكی قاوە.




ئابی و کۆمپانیاکەی بواریان نەدا هەلومەرجە پیشەسازی و ئابوورییەکان بەرەو کەشێکی خراپتر بیانگۆڕان، بەڵکوو لەباتی ئەوە، ئەوان هەلومەرجەکانیان بۆ دۆخێکی باشتر گۆڕین.




شارەزایان لەسەر تاپای جیهانەوە دەهاتن بۆ ئەوەی خۆیان بە سەرکەوتن و گۆڕانی کۆمپانیاکەی ئابی دەوڵەمەند بکە و لێی بکۆڵنەوە. بە چەشنێک، ئابی بانگهێشتکرا بۆ ئەوەی لە چەندان کۆنفرانسدا وتار پێشکەش بکات.

بە هەستێکی پڕ لە وزەوە دەربارەی دەنکی قاوە قسەی دەکرد. لە دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک، ئیدی بڕیاری دا وانەی دەنکی قاوە لەگەڵ جیهاندا بکاتەوە.



بە یاریدەی منداڵەکانی کە لە ئامادەیی بوون و بیریان لە کۆلێژ دەکردەوە، ئابی لە پێناو گەیاندنی پەیامی دەنکی قاوە، لەگەڵ هەر گرووپێک، ڕێکخراوێک و کۆمپانیایەک کە گوێی لێ دەگرن، کارە خاترجەمەی خۆی بەجێ هێشت.



ناوەناوە کۆبوونەوەی لەگەڵ مامۆستا جاکسۆن دەکرد و دەیزانی کە دەنکی قاوە بۆ ئەبەد ژیانی گۆڕیوە. بۆیە ئێستەیش ئەوە ئامانج و بەرپرسیاریەتی وی بوو، بۆ ئەوەی ئەوەندەی پێی دەکرێ ئەو وانەیە بە گوێی خەڵکیدا بدات.



بۆ ئەو مەبەستەیش ئەمەی کرد.



ئابی بە درێژایی ژیانی، پەیامی دەنکی قاوەی لەگەڵ هەموو کەسێکدا باس کرد.

لەگەڵ بازرگانەکان، قوتابخانەکان، تیمەکانی وەرزشکردن، نەخۆشخانە و بگرە لەگەڵ منداڵانیش باسی ئەو دەنکە قاوەیەی دەکردەوە.

ئەو پەیامەی لە گەورەترین و بچووکترین شوێنەکان دەکردەوە و هەر قەت هەستی بە ماندووبوون نەدەکرد.



چیرۆکگەلێکی پێ دەگەیشتەوە کە پەیامەکەی ژیانی خەڵکی گۆڕیوە، هەر چیرۆکێک پتر وزەی پێدەبەخشی، وای لێ دەکرد بەردەوام بێت، ساڵ لەدوای ساڵ، دەیە لەدوای دەیە.





هەرکە چوویە تەمەنەوە، خەڵکی لێیان دەپرسی ئاخۆ کەی خۆی خانەنشین دەکات، ئەویش بە پێکەنینێکەوە کە لە دڵی کەناری دەگرت، وەڵامی دەدانەوە: ”ئەو ساتە لەمە دەوەستم گەر دەنکی قاوە بوونی نەمێنێ یا گەر بمرم، جا هەر کامێکیان پێشتر بێت.“

خۆ ئەمە کار و پیشەیەک نەبوو، بەڵکە پەیامێکی ژیان بوو. ئیدی لە ئاکامدا بەلایەوە ئەهمییەتی نەبوو کە چەندێک پارەی لە بانکدا هەیە یان چەند خەڵاتی وەرگرتوون، ئەوەی لە هەموو شتێک پتر ئەهمییەتی هەبوو، ئەو گۆڕانکارییە بوو کە لە ژیانی خەڵکدا ئەفراندبووی.



کە لە کۆتایی ژیانی نزیک دەبوویەوە، چی دیکە بە فڕۆکە گەشتی نەدەکرد، یا لەسەر ستەیج نەدەوەستا، ئەمما قەت ڕێگەی نەدەدا جەستەی پیری ڕێگری لێ بکات کاریگەری لەسەر ژیانی خەڵک بئافرێنی. لەدوای ئەوەی خێزانەکەی لەگەڵی بەردەوام بوو و نەوەکانی گەورە بوون، تاکە شتێک کە هەیبوو، کات و ژیری بوو. ئیدی تەواوی ژیانی داهاتووی، بە پێدانی کات و ژیری بە خەڵک بەخشی.

زۆر جار، لە نزیک ماڵەکەی خۆی، لەسەر کورسییەک دادەنیشت، وانەی دەنکی قاوەی لەگەڵ هەر کەسێکدا باس دەکرد کە گوێی بۆ شل دەکرد.



ڕۆژێکیان، قوتابییەکی ئامادەیی کە یاری تۆپانێی دەکرد، وچانێکی وەرگرت و لەسەر کورسییەکە لە تەنشیت ئەو ڕۆنیشت. بە کەسێک دەچوو کە ترسنۆک بێت و لەژێر باری فشاردا ڕێ بکات، ئابی لێی پرسی چ باسە.



ئەو لاوە ڕوونی کردەوە کە هەموو شتێک لە ژیانیدا بە خراپی و هەڵە ڕێی کردووە. لە وانەکانی قوتابخانە کەوتووە، خۆشەویستەکەی پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندووە، هەروەها لەگەڵ باندەکەی کۆنسێرتێکی گەورەی لەبەردەمە، کەچی دڵی تەنگە. جا باسی ئەوە هەر مەکە کە لە کەشێکی تەواو نەرێنیدا ڕێ دەکات.



لاوەکە پرسی: "ژیان چییە؟"



ئابی دەستی بۆ گیرفانی برد و دنکە قاوێکی دایە و گوتی: "وەرە با بۆت باسی چیرۆکی گێزەر و هێلکە و دەنکی قاوە بکەم..."



**دەبارەی نووسەر و وەرگێڕ:** ئەبوبەکر شیوەڕەزی

ژیاننامە:

ناوی تەواوی (ئەبوبەکر ئەحمەد خدر)ە، لە ڕێکەوتی 16-09-1993 لە گوندی شیوەڕەز؛ سەر بەشارەدێی هەڵشۆ، شاری قەڵادزێ، پشدەر لە دایک بووە.

باوکی ناوی (ئەحمەد خدر)ە و دایکیشی ناوی (عائیشە حەمەد)ە.

قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی (شیوەڕەز) و ناوەندی لە قوتابخانەی (چوارچرا) و ئامادەیی لە قوتابخانەی (ئامادەیی قەڵادزێ) تەواو کردووە و نمرەی (97)ی لە بەشی وێژەیی بەدەست هێناوە، هەروەها لە مێژووی ٢٩ی ٩ی ٢٠٢٠ ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو هودا پێک هێناوە.

بڕوانامە:

دەرچووی بەشی ئینگلیزییە لە (کۆلێژی زمان- زمانی ئینگلیزی) لە ساڵی 2016 – 2017 بە پلەی (باش)، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەست هێناوە.

یەکەم کاری وەرگێڕانی:

لە ڕێکەوتی 2016/2/15 یەکەم کتێبەکانی بەناوەکانی (ئایا قورئان وتەی خوایە؟) نووسینی: دکتۆر زاکیر نایک و (باغە نهێنیەکە) نووسینی: فرانسس هۆگسن بێرنێت، لە قۆناغی سێی زانکۆ، بڵاو کردوونەوە.

نووسین:

لە (2019/1/13) کتێبێکی بۆ فێرخوازانی زمانی ئینگلیزی لەژێر ناونیشانی (فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە قۆناغی سەرەتاییەوە بۆ زانکۆ) نووسیوە.

بەرهەمەکانی:

هەتاوەکو ئێستا خاوەنی (39) بەرهەمی وەرگێڕدراوە لە بوارەکانی (ئایین، دەرونزانی، چیرۆکی فێرکاریی و گەشەپێدانی مرۆیی) و لەگەڵ شەش پەخشانگە کاری کردووە، بەناوەکانی (جودی، ڕێنما، ڕێنوێن، هەڤاڵبووکستۆری، تەفسیر و ئەدیبان).

پیشە:

ئێستە، مامۆستایە لە قوتابخانەی (ژیاری ناحکوومی – هەولێر) و سەرقاڵی کاری (وەرگێڕان و وانەی تایبەتییە) بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی.

**ئەمانەی خوارەوە ئەو کتێبانەن کە وەرم گێڕاون، بەشێکی زۆریان بڵاوکراونەوە و هەندێکیشیان وا لەژێر چاپدان:**

١- باغە نهێنیەکە_ ن: فڕانسس هۆگسن بێرنت.

٢-ئایا قورئان وتەی خوایە؟_ن: د.زاکیر نایک.

٣- ئەوینی پاشایەک_ ن: پیتەر دەینتی.

٤- سروودی کریسمس_ ن: چارلز دیکنز.

٥- پارە یاخود ئەوین؟_ن: ڕۆوینا ئاکنیامی.

٦- تووتیەکەی جەیک_ن: پۆڵ هێرن و یەتز ئۆزکان.

٧- چنگی مەیموونەکە_ن: ولیەم وایمارک جاکۆبس.

٨- ولیەم شەیکسپیر و هەشت لە دیارترین شانۆکانی بەشێوەی کورتە چیرۆک.

٩- بووکەکانی جەنگ_ن: مێریەن گرەیگ وێنتوێس_سەرپەرشتی: تروسکە محمد علاالدین.

١٠- مافەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا_ن: د.زاکیر نایک_سەپەرشتی: تروسکە محمد علاالدین.

١١- لێکچووەکانی ئایینە سەرەکییەکان_ن: د. زاکیر نایک.

١٢- پێغەمبەر محمەد لە پەرتووکە پیرۆزەکانی (جوولەکە، مەسیحی، هیندۆسی، بوزی و فارسی)_ ن: د. زاکیر نایک.

١٣- کتێبی پیرۆز چی دەڵێت لەبارەی موحەممەد (ص)؟_ن: ئەحمەد دیدات.

١٤- مەسیح لە ئیسلامدا_ن: ئەحمەد دیدات.

١٥- ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە؟_ن: ئەحمەد دیدات.

١٦- موحەممەد جێگرەوەی چاوەڕوانکراوی عیسا_ن: ئەحمەد دیدات.

١٧- ئۆلیڤەر تویست_ن: چارلز دیکنز. و:ابوبکر احمد خدر&سوزان لوقمان عزیز.

١٨- سەرجەم بەرهەمەکانی د.زاکیر نایک_و:ئەبوبەکر شیوەڕەزی&پەیام عبدالواحید.

١٩- هاوڕێگرتن__ن: ئاندرو ماثیوز__ و:ئەبوبەکر شیوەڕەزی&پەیام عبدالواحید.

٢٠- بەکوردی کردنی (٢٠) شانۆی ولیەم شەیکسپیر بەشێوەی کورتە چیرۆک__ن: ولیەم شەیکسپیر.

٢٠- یاساکانی خۆشەویستی__ن: ڕیچاردتێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢١- یاساکانی دایک و باوکایەتی__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٢- یاساکانی ژیان__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٣- یاساکانی کارکردن__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٤- یاساکانی بەڕێوەبردن__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٥- یاساکانی خەڵک__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٦ - یاساکانی دەوڵەمەندی__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٧- یاساکان بۆ شکاندن __ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٨- یاساکانی بیرکردنەوە__ن: ڕیچارد تێمپلەر__ و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٢٩- فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە سەرەتاییەوە بۆ قۆناغی زانكۆ___ ن: ابوبكر احمد خدر.

٣٠- كاتە سەختەكان__ن: چارلز دیكنز__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٣١- لەژێر پردەكە__ن: لیندا ئێدواردز__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٣٢- جەین ئێیەر__ن: شارڵۆت برۆنتێ__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٣٣- پێشبینییە مەزنەكان__ن: چارلز دیكنز__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٤٣- ئاو بۆ ژیان__ن: بێرناد سمس__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٣٥- گەشتەكانی گولیڤەر__ن: جۆناسان سویفت__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی، سوزان لوقمان.

٣٦- چۆن چێژ لە ژیان و كارەكەت دەبینی__ن: دەیل كارنگی__و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی.

٣٧- حەوت ستراتیژییە بۆ دەوڵەمەندی و بەختەوەری__ن: جیم ڕۆن__ و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی.

٣٨- هونەری گفتوگۆكردن لەگەڵ خەڵكیدا__ن: ڕۆزالی جامۆ

٣٩- هەزار خۆری درەوشاوە__ن: خالید حوسەینی__و: ئەبوبەكر شیوەڕەزی.

٤٠- کۆلارەفڕێن_ن: خالید حوسەینی_و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٤١- چیاکانیش دەنگیان دایەوە_ن: خالید حوسەینی_و: ئەبوبەکر شیوەڕەزی.

٤٢- دەنکی قاوە_ ن: جۆن گۆردن & دامۆن وێست_و: ئەبوبەکر شیوەڕزی.